# ڕەجم كردنی زیناكاری موحصەن

ایاد أحمد

یەكێك لەو بابەتانەی بەناو قورئانیەكان و نەیارانی فەرمووده دەیكەنه پێوەرێك بۆ ئەوەی بیسەلمێنن گوایه فەرمووده ناكۆكی تیایه لەگەڵ قورئان مەسەلەی بەردبارانكردنی زیناكاری موحصەن، واتا ئەو پیاوەی ژنی هێناوه یا ئەو ئافرەتەی شووی كردووه.

دیاره یەكێك له مەبەستەكانی شەریعەتی ئیسلامی بریتیه له پاراستنی وەچه (النسل)و لەو پێناوەدا زیناو داوێن پیسی حەڕام كردووەو یەكێكه له گەورەترین گوناهەكان و ئەنجامدەرەكەی سزای بۆ دانراوه له قورئان و له فەرموودەدا.

ئەوانەی بانگەشەی پێچەوانەبوونەوەی فەرمووده دەكەن لەگەڵ قورئان دەڵێن له قورئاندا خوای گەوره سزای زیناكاری دیاری كردووه به ئایەتی دووەمی سوڕەتی نور: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ﴾ كه بریتیه له سەد جەڵده، بەڵام له فەرموودەدا هاتووه كه زیناكاری موحصەن دەبێ بەردباران (رجم) بكرێ تا كوشتن، كه ئەوەش به حیسابی ئەوان ناكۆكی تیایه لەگەڵ قورئان بۆیه ئەو فەرموودانه ڕەتدەكەنەوه كه باس له ڕەجم كردن دەكەن.

ڕەتكردنەوەی ڕەجمیش سەرەتا له خەواریج دەستی پێكردو ئەوان یەكەم كەس بوون كه وتیان ئەو سزایه له قورئاندا نەهاتووه بۆیه وەرناگیرێ، ئەوەش دەمانباتەوه سەر ڕۆڵی فەرموودەو پەیوەندی لەگەڵ قورئاندا، فەرمووده بۆی هەیه گشتیەكانی قورئان تایبەت بكا (تخصيص العام)و رەهای قورئان پابەند بكا (تقييد المطلق) و كورتەی قورئان روونبكاتەوه (تبيين المجمل)، یا حوكمێكی نوی بهێنێ كه له قورئاندا نەبێ.

ابن قدامة دەگێڕێتەوه كه نوێنەرانی خەواریج هاتنه لای عومەری كوڕی عبدالعزيز (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ) و وتیان: له كتێبی خوا تەنها جەڵده لێدان هەیه، عومەر لێیان

دەپرسێ: ئێوە تەنها ئەوە وەردەگرن کە لە کتـێبی خـوا هەیـە؟ وتیـان بـەڵێ، وتـی: دەی کەواتـە ژمـارەی نوێـژەکان و روکنـەکانی و رکاتـەکانی و کاتـەکانی بـۆم دیـاری بکـەن لـە کتـێبی خـوا، هەروەها زەکاتم بـۆ دیـاری بکـەن لـە چـی دەدرێ و چـەندی لێـدەدرێ، وتیـان: چاوەڕێمان بکـە، پاشان هەر ئەو رۆژە هاتنەوە وتیان نەماندۆزیەوە لە قورئان، وتی: ئەی چۆن ئـەنجامی دەدەن؟ وتیـان لەبـەر ئـەوەی پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر) کردوویـەتی و موسـڵمانان دوای ئـەو کردوویانــە. وتــی: دەی رەجــم کــردنیش هــەر بــەو شــێوەیە، چــونکە ئــەو رەجمــی کــردووەو خەلیفـەکان و موسـڵمانان دوای ئـەو کردوویانـە. (سـەیری کتـێبی "المغـني" ابـن قدامـة، مكتبـة القاهرة، 35/9، 36).

فەرموودەکانی بەردبارانکردنی زیناکار:

چەندین فەرموودەی صەحیح هەیە لەسەر رەجـم کردنـی زیناکـاری موحصـەن، هەنـدێکیان فەرموودەی زارەکیە (قولي)و هەندێکیان کردەیی (فعلي).

فەرمووده زارەکیەکان:

-فـەرموودەی عبـدالله ی کـوڕی مەسعود (خـوا لێـی رازی بـێ) کـە پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسەر) فەرموویەتی: "لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: الثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بالنَّفْسِ، وَالتارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ" البخاری (6878) مسـلم (1676). واتا: خوێنی کەسێکی موسڵمان کە شایەتی بێنی بەوەی هـیچ پەرسـتراوێك نیـە جگـە لەخواو من پێغەمبـەری خـوام حـەڵاڵ نـابێ تـەنها بـە سـێ شـت: پیـاو یـا ئـافرەتی هاوسـەرداری

زیناکار، نەفس بە نەفس واتا کوشتنەوەی بکوژی کەسێك، ئەوەی واز لە ئاینەکەی دێنێ و لە کۆمەڵی موسڵمانان جیا دەبێتەوە.

-فەرموودەی عبادة بن الصامت (خوا لێی رازی بێ) کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) فەرموویەتی: "خُذُوا عَنِّي، خُذُوا عَنِّي، قَدْ جَعَلَ اللهُ لَهُنَّ سَبِيلًا، الْبِكْرُ بِالْبِكْرِ جَلْدُ مِائَةٍ وَنَفْيُ سَنَةٍ، وَالثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ جَلْدُ مِائَةٍ، وَالرَّجْمُ" مسلم (1690) واتا: لێم وەرگرن، خوا دەروویەکی بۆ کردنەوە، کوڕو کچی بێ هاوسەر سەد جەڵدە ووورخستنەوەی ساڵێك، پیاوو ئافرەتی هاوسەردار سەد جەڵدەو بەردباران کردن.

لەو فەرموودەیەدا دەستەواژەی (قد جعل الله لهن سبیلا) تەفسیرێکە بۆ ئایەتی: ﴿وَاللَّاتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَائِكُمْ فَاسْتَشْهِدُوا عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْ فَإِن شَهِدُوا فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا﴾ النساء: 15. ئایەتەکە قۆناغێکە لە قۆناغەکانی سزای زینا پێش ئەوەی ئایەتی جەڵدکردن بێتە خوارەوەو پێش فەرموودەکانی رەجم، ئەویش بریتیە لە بەند کردنی ئەو کەسانەی بەو کارە هەڵدەستن لە ماڵ تاکو مردن یا تاکو خوا دەروویەکیان لێدەکاتەوە.

مەسەلەی کۆکردنەوە لە نێوان جەڵد و رەجم کە لە فەرموودەکەدا هاتووە رای زۆربەی زانایان (جمهور) ئەوەیە کە نەسخ بۆتەوەو ئەو فەرموودەیە پێش فەرموودە کردەییەکانە کە پێغەمبەر (دودی خوای لەسەر) تەنها رەجمی کردووە بەبێ جەڵدە لێدان.

**فەرمووده كردەییەكان:**

**فەرموودەی رەجم كردنی ماعز و ئافرەتە غامدیەكە:**

**فەرموودەی رەجم كردنی ماعز بە چەندین سەنەدو رێگا و لە زۆربەی كتێبەكانی فەرموودە هاتووە كە لەبەر درێژبوونەوەی بابەتەكە دەقە عەرەبیەكەی هەموو فەرموودەكان نانوسین. موسلیم لە صەحیحەكەیدا هەردوو حاڵەتی رەجم كردنی ماعز و ئافرەتە غامدیەكە بەژمارەی (1695) لە فەرموودەیەكی درێژ ریوایەت دەكا كە بریدة بن الحصیب (خوا لێی رازی بێ) دەیگێڕێتەوە.**

**كورتەی فەرموودەكە ئەوەیە كە ماعزی كوڕی مالیكی ئەسلەمی هاتە لای پێغەمبەر (درودی خوا لەسەر)و داوای لێكرد پاكی بكاتەوە، پێغەمبەر (درودی خوا لەسەر) سێ جار رەتی دەكاتەوەو پێی دەڵێ داوای لێخۆشبوون لە خوا بكا بەمەبەستی ئەوەی لە دانپیانانەكەی پەشیمانی بكاتەوە، بەڵام ئەو هەر سوڕ دەبێ و جاری چوارەم پێغەمبەر (درودی خوا لەسەر) پرسیار دەكا ئایا ئەوە شێتە؟ دەڵێن نەخێر، دەپرسێ خواردوویەتیەوە؟ دەڵێن نەخێر، پاشان پرسیاری لێدەكا: زینات كردووە؟ دەڵێ: بەڵێ، ئینجا فەرمان دەكا كە رەجم بكرێ.**

**پاشان لە هەمان فەرموودە هاتووە كە ئافرەتێك لە هۆزی غامد دێتە لای پێغەمبەر (درودی خوا لەسەر) و داوای لێدەكا پاكی بكاتەوە، بەهەمان شێوەی ماعز پێغەمبەر (درودی خوا لەسەر) پێی دەڵێ بگەڕێوەو داوای لێخۆشبوون لە خوا بكە دەیەوێ پەشیمانی بكاتەوە لە دانپیانانەكەی، بەڵام ئەو سوڕ دەبێ و پێی دەڵێ كە دووگیانە لە زینا، پێغەمبەر (درودی خوا لەسەر) پێی دەڵێ رەجمت ناكەین تا منداڵەكەت دادەنێی، كە دایدەنێ هاتەوە لای، دووبارە پێغەمبەر (درودی خوا لەسەر) دەڵێ رەجمی ناكەین تا شیر بدا بە منداڵەكەی، پیاوێكی ئەنصاری دەڵێ: من منداڵەكەی بەخێو دەكەم ئەی پێغەمبەری خوا، پاشان رەجمی دەكا.**

بوخاری به ژمارەی (6814) له جابر کوڕی عبدالله دەگێڕێتەوە که پیاوێك له هۆزی ئەسلەم (که مەبەستی ماعزە چونکه له هۆزی ئەسلەم بوو) هاته لای پێغەمبەر (درودی خوا لەسەر) و چوار شایەتی لەسەر خۆیدا که زینای کردووە، پێغەمبەر (درودی خوا لەسەر) فەرمانیدا که رەجم بکرێ.

هەروەها به ژمارەی (6815) له ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە، به ژمارە (6824) له ابن عباس دەیگێڕێتەوەو لەوێ ناوی ماعز دەهێنێ.

ئەمە بێجگه له کتێبەکانی تری سوننەن و موسنەدەکان له چەندین شوێن هاتووەو دووبارە بۆتەوە، نمونەی ئەوانه نەسائی به ژمارە (7125) باسی ماعز به ژمارە (7148) باسی ئافرەته غامیدەکه ریوایەت دەکا، ترمزی (1428)، أبو داود (4419)، ابن ماجه (2554)، أحمد (9809)، مالك له (الموطأ) به ژمارە (1756) رەجمی ماعز ریوایەت دەکاو به ژمارە (1759) هی ئافرەته غامدیەکە، ابن حبان (4400)، حاکم (8079)، بیهقی (11449)، البغوی له (شرح السنة) به ژمارەی (2584)، دارمی به ژمارە (2364) هی ماعز به ژمارە (2369) هی غامدیە، دارقطني به ژمارەی (3129) هەردوو رووداوەکه باس دەکا...هتد

هەموو ئەوانەش وەك وتمان له چەندین شوێنی کتێبەکانیان به شێوازو سەنەد و رێگای جۆراوجۆر و له چەندین هاوەڵەوە فەرمووەکانیان ریوایەت کردووە.

فەرموودەی رەجم کردنی خێزانی پیاوێکی ئەعرابی:

ئەو فەرموودەیەش له زۆربەی صیحاحەکان و سونەن و موسنەدەکان هاتووە، کورتەکەی ئەوەیە که دوو پیاو دێنه لای پێغەمبەر (درودی خوا لەسەر) یەکێکیادن دەڵێ به کتێبی خوا حوکم بکه له نێوانمان، ئەوی تر دەڵێ بەڵی به کتێبی خوا حوکم بکه، کوڕی من لەلای ئەو

**پیاوە کاری دەکرد زینای لەگەڵ خێزانەکەی کرد، وتیان کوڕەکەم دەبێ ڕەجم بکرێ منیش سەد مەڕ و کەنیزەکێکم پێدا بۆ رزگارکردنی، پاشان پرسیارم کرد وتیان کوڕەکەم جەڵدی لێدەدرێ و ساڵێك دوور دەخرێتەوە و خێزانەکەی ئەو پیاوە دەبێ ڕەجم بکرێ، پێغەمبەر (درودی خوا لەسەر) فەرمووی: بە کتێبی خوا حوکم دەکەم لە نێوانتان، مەڕەکان و کەنیزەکەکەت بۆ خۆت، کوڕەکەت سەد جەڵدەی لێدەدرێ و ساڵێك دووردەخرێتەوە، ئەی ئونەیس تۆش بڕۆ لای ئافرەتەکەی ئەو پیاوە ئەگەر دانینا بە زینا ئەوا ڕەجمی بکە، کە ئونەیس چوو ئافرەتەکە دانینا بە تاوانەکەی و ڕەجم کرا.**

**ئەو فەرموودەیە لە ئەبو هوڕەیرەو زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی (خوا لێیان رازی بێ) گێڕدراوەتەوە، بوخاری ریوایەتی کردووە بە ژمارەی (2724) موسلیم (1697) نەسائی (5932) ترمزی (1433) ئەبو داود (4445) ابن ماجه (2549) أحمد (17042) ابن حبان (4437)... هتد.**

**مەسەلەی حوکم کردن بە کتێبی خوا کە لە فەرموودەکەدا هاتووە چەند راڤەیەکی بۆ کراوە، لەوانە کتێبی خوا مەرج نیە مەبەستەکە پێی قورئان بێ بەڵکو بە مانای حوکمی خواش دێت، یا لەوانەیە مەبەستی ئەوە بێ کە خوا دەروویەکی لێیان کردۆتەوە کە لەو ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کراوە ﴿وَاللَّاتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَائِكُمْ فَاسْتَشْهِدُوا عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْ فَإِن شَهِدُوا فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا﴾ النساء: 15 لە ئەڵقەی رابردووش ئاماژەمان بەوە دا، یا ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێ کە پێشتر ئایەتی ڕەجم کردن لە قورئاندا هەبووە وەك لە فەرموودەی صەحیحی بوخاری هاتووەو ئیمامی عومەر (خوا لێی رازی بێ) ریوایەتی دەکا بەڵام پاشان خوێندنەوەکەی نەسخ کراوەتەوە تەنها حوکمەکەی ماوەتەوە.**

**فەرموودەی رەجم کردنی پیاوو ئافرەتێکی جولەکە:**

دیارە پێش ئیسلام لە ئاینی یەهودیەتدا رەجم کردنی زیناکار هەبووە، ئێستاش لە تەوڕات (العهد القدیم) ئەو حوکمە هەر ماوە، لە سفری تەسنیە ئیصحاحی 22 ئایەتی 21 هاتووە: "یؤتي بالفتاة إلي باب بيت أبيها ويرجمها رجال مدينتها بالحجارة حتي تموت، لانها ارتكبت قباحة في إسرائيل، وزنت في بيت أبيها" واتا کچەکە لەبەردەم دەرگای ماڵی باوکی بەردباران دەکرێ تا دەمرێ لەبەر ئەوەی شتێکی ناشیرینی کردووە لە ئیسراٸیل و زینای لە ماڵی باوکی کردووە.

لە ئایەتی 23 هاتووە: "وإذا التقي رجل بفتاة مخطوبة لرجل آخر في المدينة وضاجعها، فأخرجوهما كليهما إلي ساحة بوابة تلك المدينة، وارجموهما بالحجارة حتي يموتا" واتا: ئەگەر پیاوێك گەیشت بە کچێك کە دەسگیرانی پیاوێکی تر بوو لە شار و لەگەڵی خەوت، ئەوا هەردووکیان بهێننە گۆڕەپانی دەروازەی ئەو شارەو بەردبارانیان بکەن تا مردن.

لەسەردەمی پێغەمبەریشدا (درودی خوای لەسەر) پیاوێکی جولەکە زینای کرد لەگەڵ ئافرەتێك و جولەکەکان هاتنە لای پێغەمبەر، ئەویش فەرمووی: لە تەوڕاتدا چی هەیە دەربارەی رەجم کردن؟ وتیان تەنها ئابڕویان دەبەین و جەڵدەیان لێدەدەین، لەو کاتەدا عبدالله ی کوڕی سلام (خوا لێی رازی بێ) کە پێشتر جولەکە بوو موسڵمان بوو بوو وتی: درۆ دەکەن، لە تەوڕاتدا رەجم هەیە، تەوڕاتیان هێنا، یەکێکیان دەستی خستە سەر ئایەتی رەجم و پێشی و پاشی خوێندەوە، عبدالله وتی: دەستت لابە، کە دەستی لابرد ئایەتی رەجمیان دۆزیەوە، وتیان: عبدالله راست دەکا ئەی محمد، ئایەتی رەجمی تیایە، پیاو و ئافرەتەکە رەجم کران.

ئەو فەرموودەیە بوخاری لە عبدالله کوڕی عومەر بە ژمارە (6841) دەگێڕێتەوە، موسلیم بە ژمارە (1699) نەسائی (7177) ئەبو داود (4446) ...هتد.

دەمێنێتەوەچەند خاڵێك بخەینە بەر باس سەبارەت بەو فەرموودانەو بە سزای رەجم کـردن و ئەو رەخنانەی لێی دەگیرێ:

1- سەرەتا پێویستە ئەوە بڵێین کە لەو سـەردەمەدا کاتێـك باسـی رەجـم دەکـەین ئـەوا باسـی سزایەکی ون و جێبەجێنەکراو دەکەین، تەنها لە چەند شوێنێکی کـەم نـەبێ. بـەو واتایـەی کـە جێبـەجێکردنی سـزای رەجـم پێویسـتی بـە دەوڵـەتێك هەیـە کـە ئـەحکامی شـەریعەتی ئیسـلام جێبەجێ بکاو قازی حوکمی لەسەر بـدا، کـە ئـەوەش ئێسـتا نیـە، بۆیـە هـیچ کەسـێك بـۆی نیـە لەلای خۆیەوە ئەو سزایە جێبەجێ بکا بەسەر زیناکار.

2- ئیسلام دینێکی گشتگیرەو هەموو سیستەمەکانی تـەواوکاری یـەکترن و نـاکرێ تـەنها یـەك سیستەم بهێنی و جێبەجێی بکەی و بڵێی ئەوە ئیسلامە، لەبەر ئەوە سیستەمی حدود و سزاکان کە بۆ تاوانە جۆراوجۆرەکان دانراوە تەنها یەك لایەنە لە ئیسـلام و نـاکرێ هـەموو ئیسـلام لـەو سیسـتەمەدا کۆبکرێتـەوە، ئـەو سیسـتەمەش کاتێـك جێبـەجێ دەکـرێ کـە هـەموو لایەنـەکان و سیسـتەمەکانی تـری ئیمـانی و پـەروەردەیی و فیکـری و کۆمەڵایـەتی و ئـابوری و سیاسـی و کارگێڕی .. هتد جێبەجێ بکرێ، هەر لـەو روانگەیەیـە کاتێـك ئیمامی عومـەر (خـوا لێـی رازی بێ) لەساڵی برسیەتی لە مەدینە سزای بڕینی دەستی دز جێبـەجێ ناکا لەبـەر ئـەوەی ئەوانـەی دزیان کردبوو بەهۆی برسیەتی بـوو، واتـا لایـەنی ئـابوری و کۆمەڵایـەتی ئـەو کـاتی کۆمەڵگـەی مەدینە گونجاو نەبوو بۆ جێبەجێ کردنـی ئـەو سـزایەو بـووە هـۆی بـوونی شـوبهەو گومـان کـە سزاکانیش لە کاتی شوبهە دەوەستێنرێن (الحدود تدرأ بالشبهات)، سـزای رەجمـیش لـەوە بـەدەر نیە، واتا دەتوانین بڵێین لە کۆمەڵگایەك جێبەجێ دەکرێ کە ئیمـان و ئیسـلام چووبێتە نـاخی تاکەکان و، هۆکارەکانی وروژاندن و فریودانی گەنجان و تێکەڵاوی بێ سنورو ناشەرعی لـە نێـوان پیاوان و ژنان بوونی نەبێ، ئافرەت بە جلی رووت و وروژێنەر نەچێتە دەرەوە کە ئەوە بەشێکە لە گرتنی رێگاکانی زینا، زانایان و بانگخوازان رۆڵی گرنگی خۆیان هەبێ لـە هۆشـیار کردنـەوەی

خـەڵك و ئامۆژگاریکردنیـان، سیستـەمی پـەروەردە یارمەتیـدەر بـێ بـۆ پێگەیانـدنی گـەنجانێکی لەخوا ترس و داوێنپاك..

3- لـە کۆمـەڵگای ئیسلامیدا ئەصڵ بریتیـە لـە داپۆشـینی عـەیب و عـارو گوناهـەکان نـەك ئیعلانکردنیان و گەیاندنیان بۆ لای قازی و لایەنی پەیوەندیدار، واتـا کاتێـك کەسـێك گوناهێـك دەکا با ئەو گوناهە زیناش بێ، کەسێکی تر بـینی ئەصڵ ئەوەیـە کـە سـەتری بکـاو گوناهەکـەی داپۆشێ و ئاشکرای نەکا، یا هەر خۆی ئامۆژگاری بکا کە خۆی لەو گوناهەو لە تووڕەبوونی خـوا بپـارێزی، ئـەوەش وا دەکـا جێبـەجێکردنی سـزای ڕەجـم تەسـك ببێتـەوەو نەگاتـە لای قـازی. بەڵگەی ئەمەش هەر لە چیرۆکی ڕەجم کردنی ماعز لە یەکێك لە ریوایەتـەکانی فەرموودەکـەدا هاتووە کە ماعز پیاوێـك بـەخێوی کـردووە بـەناوی (هـزال) زیناکـەی لەگـەڵ کـەنیزەکێکی ئـەو پیاوەدا کردووە، هەر ئەویش پێی دەڵێ کـە بچێتە لای پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر) و دان بەگوناهەکەی بنێ، پاشان پێغەمبەر (درودی خـوای لەسـەر) لـە هـزال دەڵـێ: "واللە یـا هـزال، لـو کنـت سـترته بثوبـك، كـان خـيرا مما صـنعت بـه" أحمـد (21890) واتـا: ئـەی هـەزال ئەگـەر داتپۆشیبا باشتر بوو لەوەی بەسەرت هێنا.

4- دیارە ئیسلام بۆ سەلماندنی زینا مەرجی زۆر قورسی داناوە بە شێوەیەك کە زۆر زەحمەتە لە ڕێـی شـایەتیدان بسـەلمێنرێ، مەگـەر ئەوانـەی زینایـان کـردووە خۆیـان دان بـە گوناهەکـەیان بنـێن، ئـەو حاڵەتانـەش کـە لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا (درودی خـوای لەسـەر) ڕوویانـداوە وەك باسمان کرد هەمووی لەڕێی دانپیانان بوو نەك شایەتیدان.

مەرجی سەلماندنەکەی ئەوەیە کە چوار کـەس بەچـاوی خۆیـان کردەکـە ببیـنن، وەك زانایـان دەڵێن (كالميل في المكحلة) واتـا کارەکـە وا ببیـنن کـە چۆن کل دەچـێتە نـاو کلدان، ئەگـەر سـێ کەسیان وتیان ئێمە وەك کل و کلدان بینیومانـە بـەڵام یـەکێکیان بڵـێ مـن تـەنها بینـیم پیـاو و ژنەکـە بەیەکـەوە بـوون، ئـەوا سـزاکە جێبـەجێ نـاکرێ بـەڵکو سـێ کەسـەکە سـزای قـەزف و

بوهتانیان بەسەر جێبەجێ دەکرێ کە بریتیە لە 80 جەڵدە. ئـەوەش بۆ ئەوەیـە کـە ئەوانـەی دەیانەوێ شایەتی بدەن لەسەر گوناهی زینا هەست بە بەرپرسیاری بکەن و خۆیان بپارێزن لـەو شایەتیدانە.

5- سـەرەڕای ئـەو هـەموو دووربـینی و زەمانەتـەی ئیسلام داینـاوە بـۆ ئـەوەی کۆمـەڵگای ئیسلامی دوور بـێ لـەو گوناهـەو ئـەو مەرجـە قورسـانەی دانـراوە بـۆ سـەلماندنی و ئەگـەر ئەنجامیش درا ئەوا بشاردرێتەوەو ئاشکرا نەکرێ، ئەوا ئەگەر کەسێك زینای کرد خێزاندار بـوو چوار کەس شایەتیاندا لەسەری و هەموو مەرجەکانی شایەتیدانی تیا هاتە جێ، ئەوا ئەو کەسـە شایەنی ئەوەیە سزا بدرێ، لەبەر ئەوەی کەسێك زینـا بکـا لـە کاتێکدا چـوار کـەس ببیـنن کـە بەتەواوەتی کارەکە دەکا دیارە ئەو کەسـە بـەبێ شـەرمی و ئاشـکرا زینـای کـردووە، لەبـەر ئـەوە شایەنی ئەوەیە سزا بدرێ، جا ئەگەر خێزاندار بـوو ئـەوا رەجـم دەکـرێ ئـەگینا سـەد جەڵدەی لێدەدرێ.

6- پاشان ئەوانەی بانگەشەی عەقلانیەت دەکەن، هەر بە عەقڵ ئەگەر بیری لێبکەینەوە، ئایا دەکرێ کەسێکی زگورتی سـزای وەك ئـەوە وابـێ کـە خێزانـدارە؟ ئایـا ئـەوە لەگـەڵ عەدالـەت و دادپەروەری خوا دەگونجێ؟ ئەوەی گەنجە هێشتا پەیوەندی لەگەل رەگەزەکەی تـر نەبەسـتووەو نەیچەشتووە ئەگەر تووشی گوناهی زیناش بێ ئایا دەکـرێ سـزای لەگـەڵ ئـەو کەسـەی کـە ژنـی هێنـاوە یـا ژن کـە شـووی کـردووە وەك یـەك بـێ؟ لـە کاتێکـدا ئـەوان خـوا بەحـەڵاڵی فرسـەتی بەکارهێنانی شەهوەتی پێبەخشیون.

7- سـەبارەت بـە فـەرموودەکانی رەجـم هـیچ گومانێـك لـە راسـت و دروسـتیان نیـەو زۆر لـە زانایان گەیاندوویانەتە ئاستی فەرموودەی موتەواتیری مەعنەوی، واتا لە واتاکانیدا موتـەواتیرن نەك لە وشەو وتەکانیدا، سیوگی و الکتانی تەنها چیرۆکی رەجم کردنی مـاعز دەگەیننـە ئاسـتی موەتـەواتیر، سـەیری (قطـف الأزهـار المتنـاثرة في الأخبـار المتـواترة، السـيوطي، المكتـب الإسـلامي،

1985، ص223) (نظم المتناثر من الحديث المتواتر، محمد بن جعفر الكتاني، دار الكتب السلفية، ص163)، ئەمە بێجگە لە فەرموودەکانی تری رەجم، زیاتر لە 15 هاوەڵ فەرموودەکانی رەجمیان ریوایەت کردووە، لەوانیشەوە دەیان تابیعی و قوتابیەکانیان فەرموودەکانیان ریوایەت و بە چەندین سەنەدو رێگای جیاواز رۆیشتووە تا سەردەمی نوسینەوە، لە صەحیحی بوخاری هەشت هاوەڵ و لە صەحیحی موسلیم دوانزە هاوەڵ فەرموودەکانی رەجمیان ریوایەت کردووە، لەوانە ئەبو بەکری صدیق، عومەری کوڕی خەتاب، عەلی کوڕی ئەبو تالیب، جابر کوڕی عبداللە، زەید کوڕی خالید، ئەبو هورەیرە، ابن عباس، عبداللە کوڕی مسعود، عبداللە بن أبی أوفى، عوبادە کوڕی صامت، بریدە بن الحصیب، جابر کوڕی سەمورە، عمران بن حصین، أبو سعید الخدری (خوا لێیان رازی بێ).. ئایا هەموو ئەو هاوەڵە بەڕێزانە درۆ دەکەن؟! هەموو کۆك بوون لەسەر درۆ کردن بەدەم پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر)؟! پاشان ئەو هەموو تابیعیەی دوای ئەوان و ئەوانی تری لە تابیعیەکانیان وەرگرتووە ئایان هەموو درۆیان کرد؟! ئەوانەی ئەو فەرموودانە رەت دەکەنەوە نازانم لەسەر چ ئەساسێکە؟! بە چە بەڵگەیەکی عەقڵی قەناعەت پێکەر ئەوە دەکەن؟! بۆمان بسەلمێنن بە شێوەیەکی زانستیانە کە ئەو هەموو فەرموودەو ریوایەتانە درۆیەو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) کەسی رەجم نەکردووە..! ئێستا لە هەر یەك لە ئێوە بپرسین ئەگەر 10 کەس هاتن و هەواڵێکیان بۆ هێنان، بێ ئەوەی ئەو دە کەسە پێشتر رێککەوتبن لەسەر ئەو هەواڵە یەك شتیان باسکرد بەدەر لەوەی لە وشەو دەستەواژەکانیان جیاوازی هەبوو، ئایا دەتوانن ئەو هەواڵە بەدرۆ بخەنەوە؟ ئەگەر ئەوە بکەن بە چ حوججەیەك و بەبەڵگەی چی؟ ئایا دەتوانن حوکم بدەن کە هەموو ئەوانە رێککەوتوون لەسەر درۆکردن؟!

بۆیە رەتکردنەوەی ئەو فەرموودانە هیچ ئەساسێکی زانستی نیە، هێشتا ئەگەر رای شێخ محمد أبو زهره یا شێخ یوسف القرضاوي بهێنن تا رادەیەك رێی تێدەچێ، محمد أبو زهری رای

وابووه كه ڕەجم كردنی ماعز و غامدیه پێش دابەزینی ئایەتەكەی سوڕەتی نور بووه واتا بە ئایەتی نور ئەو حوكمه نەسخ بۆتەوە، هەرچی قەرەزاویە دەڵێ كە ئەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) تەعزیر بووه واتا سزایەكە دەگەڕێتەوە بۆ حاكم و دەسەڵاتدار و بەپێی راو تەقدیری ئەو دەگۆڕێ، ئەو دوو رایە كە لەلایەن دوو زانای گەورەو موعتەبەڕ هاتووه وەك وتمان هێشتا هەندێك ڕێی تێدەچی، بەڵام ئەوەی نەیارانی فەرمووده دەیكەن هیچ بنەمایەكی نیە، لەبەر ئەوەی رەتكردنەوەی ئەو هەموو فەرموودەیە شتێكی ناماقوڵەو تۆمەتباركردنە بە درۆ بۆ هاوەڵان و تابیعین و هەموو ئەوانەی دوای ئەوان هاتوون، لەبەر ئەوەی خەواریج و بەشێكی موعتەزیلەی لێدەرچێ هەموو هاوەڵان وتابیعین و تابیعی تابیعین و چوار مەزهەبەكە بەڵكو هەر هەشت مەزهەبەكە و هەموو زانایانی ئەهلی سوننە كۆكن و ئیجماعیان هەیە لەسەر سزای رەجم.

8- دەمێنێتەوە گومانێك بڕەوێنینەوە لەسەر ئایەتی ﴿وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِكُم بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلَا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنكُمْ وَأَن تَصْبِرُوا خَيْرٌ لَّكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ النساء: 25 كە زۆر جار ئەوانەی ئینكاری سزای رەجم دەكەن دەیكەنە بەڵگە بۆ بۆچوونەكانیان، ئەویش لەو شوێنە كە دەفەرموێ ﴿فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ﴾ ئایەتەكە باسی كەنیزەك دەكا كە ئەگەر زینایان كرد ئەوا نیوەی ئافرەتانی سەربەست سزایان بۆ هەیە، جا ئەو كەسانە دەڵێن ئافرەتی سەربەست كە شووی كردبوو ئەگەر سزای رەجمی بەسەردا سەپێنرا ئایا نیوەی سزای رەجم چیە؟ چونكە دیارە رەجم واتا كوشتن كە ئەوەش نیوەی نیە، ئایا مردن نیوە دەكرێ؟ ئەو گومانە یەكەمجار خەواریج هێنایان و لەوانەوە ماوەتەوە بۆ ئەوانەی ئێستا.

لـه وەڵـامی ئەمـەدا دەبـێ بـزانین مەبەسـت چـیە لـە (المحصـنات)؟ ئایـا بـاس لـە ئافرەتـانی سەربەستی بێ هاوسەر دەکا یان ئافرەتانی سەربەستی هاوسەردار؟ بە گوێرەی ئایەتەکە ئەگەر بگەڕێینەوە سەرەتاکەی ئەوا مەبەستەکەی ئەو ئافرەتـە سەربەسـتانەن کە شوویان نـەکردووە، لەبـەر ئـەوەی سـەرەتای ئایەتەکـە باسـی نیکـاح دەکـا ﴿وَمَـن لَّـمْ يَسْـتطِعْ مِـنكُمْ طَوْلًـا أن يَـنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ﴾ واتا ئەو پیاوانەی کە توانای داراییان نیە کـە ئافرەتـانی سەربەسـت مـارە بکەن، لەسەرەتای ئایەتەکە گومان لەوەدا نیە وشەی (المحصنات) مەبەسـتی ئـەو ئافرەتانـەن کـە شوویان نەکردووە چونکە باسەکە باسی ئەوەیە کـە پیـاوان مارەیـان بکـەن و نیکاحیـان لەگەڵـدا بکـەن، دیـارە خـۆ نیکـاح لەگـەڵ ئافرەتـانی بـەمێرد نـاکرێ، بۆیـە ئـەوەی دواتـر لـە بڕگـەی ﴿فعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا علَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ﴾ وشەی (المحصـنات) هـەمان ئـەو (المحصـنات)ەیـە کە لەسەرەتای ئایەتەکەدا هـاتووە واتـا لـە ﴿ وَمَـن لَّـمْ يَسْـتطِعْ مِـنكُمْ طَوْلًـا أن يَـنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ﴾، ئەگەر بەلایەنی زمانەوانی شی بکەینەوە ئەوا (ال) لە وشەی (المحصنات) لە بڕگەی ﴿فعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا علَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ﴾ بریتیە لە (عهدية) نەك (جنسية)، واتا هـەموو ڕەگـەزی ئافرەتـانی سەربەسـت ناگرێتـەوە بـەڵکو تـەنها ئەوانـە دەگرێتـەوە کـە لەسـەرەتای ئایەتەکەدا باس کراوە، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە کاتێك دەڵێین: (الكتاب خير أنيس) لەو ڕستەیەدا (ال) لە وشەی (الكتاب) بریتیە لە (جنسية) واتـا هـەموو ڕەگـەزی کتێـب دەگرێتـەوەو ماناکـەی کتێب باشترین دۆست و برادەرە، بەڵام لە ڕستەی (اشتريت كتاباً ثـم بعـت الكتـاب) ئـەوا (ال) لـە وشەی (الكتاب) مەبەستی هەموو کتێبێك نیەو ڕەگەزی کتێب ناگرێتەوە بەڵکو (ال) بریتیـە لـە (عهدية) واتا تەنها ئەو کتێبەی کڕیبووم فرۆشتمەوە.

بۆیـە لـە ئایەتەکەشـدا وشـەی (المحصـنات) لـە کۆتـایی ئایەتەکـەدا هـەر هـەمان ئەوەیـە کـە لەسـەرەتای ئایەتەکـەدا هـاتووە، واتـا ئـەو ئافرەتـە سەربەسـتانەی کـە شـوویان نـەکردووە، کـە

**ئەوانیش سزایان بریتیە لە سەد جەڵدە، ئافرەتی کەنیزەکیش ئەگەر زینای کرد ئەوا تەنها پەنجا جەڵدەی لێدەدرێ.**